# تحذیر و ئاگادارکردنەوەی

# سەلەف رحمهم الله تعالى

# لە ئەهلی بیدوع



طارق الكردي

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله رب العالمين، وصلى الله وسلم على حبيبنا محمد وعلى آله واصحابه أجمعين.

أما بعد :

تحذير و ئاگادارکردنەوەی سەلەف رَحِمَهُمُ ٱللَّهُ لە ئەهلی بیدەع، وە دوور بوون لێیان، وە دانەنیشتن لەگەڵیاندا ، وە نەخوێندنەوەی کیتابیان، گوێ نەگرتن بۆ دەرس و درووسیان، ئەمانە شتانێکن کە لە سەلەفەوە وارید بوون بۆ ئێمە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە دڵی ئادەمیزاد، دڵی ئینسان بەجۆرێکە زوو کاریگەر ئەبێت بە کۆمەڵێک قسە و مەسائیل، زۆرجار نەفسی ئینسان وەهای لێدێت زاڵ دەبێت بەسەر ئیمانەکەیدا پەنا بە الله، شەیتانیش دایم لەکەمینندایە تا لە ڕێگایەکەوە تۆ فریو بدات بەتایبەت لە بواری عقیدەو بیروباوەڕدا، بۆیە پێویستە لەسەر ئینسانی باوەڕدار، کەسێک کە عەقیدەیەکی سەلیم و تەندرووستی ئەوێت، ئەیەوێت لەسەر مەنهەجی پێغەمبەر عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ بڕوات لەسەر مەنهەجی هاوەڵان و تابعین، پێویستە دووربێت لە ئەهلی بیدەع، لە دەرسیان بەشداری نەکات و کتێبیان نەخوێنێتەوە، دانەنیشێ لەگەڵ یاندا، بۆ ئەوەی وەکو ئەوانی لێ نەیێت و حیسابی ئەوانی بۆ نەکرێت، بۆیە لە حدیث دا هاتووە ( لا تُصَاحِبْ إِلَّا مُؤْمِنًا ) هاوڕێیەتی کەس مەکە ئیللا ئیماندار نەبێت، ( المَرءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ ) هەرکەسێ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، واتە خو ڕەوشت و ئاکارەکەی وە عەقیدەو بیروباوەڕەکەی وەرئەگرێت.

لەتەرجەمەی ئیمامی بەربەهاری ــیا هاتووە ئەفەرمێت ( كان شديد على اهل البدع والمعاصي ) زۆر توندبووە بەرامبەر بە ئەهلی بیدەع.

[ البداية والنهاية]

ئیمام بەرامبەر کەسانێک تووندبووە کەشتانێکیان داهێناوە لەدین ــدا و زیادیان کردووە کەهیچ بناغەیەکی نیە، نە لەقورئان نە لەسوننەت نە لە ئەفعال و ئەقوالی صحابە، بۆیە هەمیشە بیدعە وە ئەهلی بیدەع ئەوانەی کە دوور بوون لەمەنهەجی صحابە و سەلەف، هەمیشە لای سەلەف بێزراو بــوون و تەعامولیان لەگەڵــدا نــەکردوون وە بەخــراپ سەیریان کردوون و ئومێدی خێریشیان پێ نەخواستوون.

١- **سفیانــی ثەوری** دەربارەی بیدعە و داهێنان لەدینــدا و لە عەقیدەو بیروباوەڕدا، شتێــک کەهیــچ بناغەیەکــی نە لەقورئان و سوننــەت نە لە ئەقوال و ئەفعالی صحابە نە لە ئەوانــەی کە دەستگرتوون بەو مەنهەجەوە و بوونــی نیە، بەڵام کەسێک بێت و دای بێنێت و پەیڕەوی لێ بکات و بەدینی شی دابنێت، خەڵکیشی بۆ دەعوەو بانگەواز بکات بەناوی دینەوە،

سفیانی ثەوری دەربارەی ئەفەرمێ: بیدعە لەلای ئیبلیس خۆشەویستترە لە تاوان، لەبەر ئەوەی تاوان تۆبەی لێ ئەکرێ بەڵام بیدعە تۆبەی لێ ناکرێت.

[ ذم الكلام (١٢١/٥) و شرح أصول الإعتقاد (١٤٩/١) و شرح السنة للبغوي (٢١٦/١) ]

واتە عادەتەن کەسی بیدعەچی بیدعەکەی خۆی پێ عیبادەتەو بەچاکی دەزانێت بۆیە تۆبەی لێ ناکات بەڵام تاوانی دیکە خاوەنەکەی تۆبەی لێ دەکات و پەشیمان دەبێتەوە.بۆیە تاوانێکی وەک بیدعە خراپترە کەخاوەنەکەی ئامادەنییە تۆبەی لێ بکات وەک تاوانێک کەخاوەنەکەی بەشیمانی دای دەکرێت لەسەری.

**٢ـ** أرْطَأة **كوڕی منذر** ئەفەرمێ: ئەگەر کوڕەکەی من کەسێکی فاسق بێت، کەسێکی تاوانبار بێت لەو تاوانبارانە، زۆر پێم خۆشترە لەوەی کە کەسێک بێت صاحبی هەوا بێت.

[ الإبانة الكبرى (٢/٤٤٦) ]

واتە کەسێکی موبتەدیع بێ و کەسێک بێت لای دابێت لە مەنهەجی صحابە و لە مەنهەجی پێغەمبەری خوا عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ ، شوێن مەنهەج و ڕێباز و ڕێسایەکی کە کەوتبێ کە دووربێ لەو مەنهەجە ، ئەگەرچیش پێی وابێ هەمان مەنهەجی هاوەڵانە.

**٣- ابو اسحاق الفذاری** دەفەرمێ: دانیشتن لەلای نصارا، لە معامەلاتیاندا، خۆشەویسترە لەلام لەدانیشتن لەکۆڕو مەجلیسێ کە موناقەشەو جیدال و دەمە دەمێ بکرێ لەسەر دین، خەڵکی خەریکی نیقاش و موناقەشات بن لەدیندا.

[ الإبانة الكبرى ٩٢ ]

**٤- یونسی کوڕی عوبەید** ئەفەرمێ: ئەگەر کوڕەکەم هاوەڵایەتی کەسانێکی لەسنوور دەرچوو بکات، کەسانێکی چەتەو ڕێگر و خەریکی دزی کردن بن، پێم خۆشترە لەوەی هاوەڵایەتی کەسێکی موبتەدیع بکات.

[ الإبانة الصغرى ٩٣ ]

ئەگەرچی هاوەڵایەتی ئەوکەسانەش خراپە بەڵام خراپی ئەمی تریان ترسناکترە!

لەبەرئەوەی ڕاستەخۆ زیانی بۆ عەقیدەو بیروباوەڕ و بۆ دینت هەیە، زیان گەیاندن لە ڕەوشت ئەهوەنترە لە زیان گەیاندن لە عەقیدەو بیروباوەڕ، ئەگەرچی کاریگەری هەیە، بەڵام کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی وەکو ئەوە نییە کە ئینسان بکەوێتە ژێر کاریگەریەکەوە کە ئینحراف بکات لە عەقیدەکەی.

**٥**- هەروەها ئەفەرمێت: بەیونسی کوڕی عوبەید یان فەرموو : منداڵەکەت یاری ئەکا بەهەندێ لە باڵندەکان.....،

ئەویش فەرمووی: بەڵکو ئەو یاریکردنەی بەو باڵندانە و مەژغوڵ بوونی بەکومەڵێک یاری کردنەوە، هۆکارێک بێت بۆ ئەوەی مەژغوڵی بکات لەوەی کە هاوەڵایەتی کەسانی موبتەدیع بکات.

**[ الإبانة ٩٤ ]**

واتە ئەمە زۆر باشترە بۆ ئەو، ئەگەرچی بەوەوە مەژغوڵە و دوور کەوتوەتەوە لە فێربوونی عیلم، بەڵام باشترە بۆی کە هاوەڵایەتی کەسانی موبتەدیع بکات.

**٦- سعیدی کوڕی جوبەیر** ئەفەرمێ: ئەگەر کوڕەکەم هاوەڵایەتی کەسانێکی خراپەکار و فاسق بکات، کە خەریکی مەعصیەتن،

بەڵام کەسێک بێت دەست گرتوبێت بە عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعەوە...،

پێم خۆشترە لەوەی هاوەڵایەتی کەسانێک بکات کە ئەم کەسە خەریکی عیبادەت کردن بێت، بەڵام ئەوکەسە موبتەدیع بێت.

**[الإبانة الصغرى ٨٩]**

هێندە بیدعەیان بەترسناک تەماشا کردووە، سەلەف بەو جۆرە بوون.

٧- **بە مالیكی كوڕی میغوەل** یان ووت: ئەبینین كوڕەكەت یاری ئەكات بە باڵندە، بە طیر...،

فەرمووی: بەڵكو ئەمە هۆكارێكە بۆ ئەوەی كە دووركەوێتەوە لەهاوەڵایەتـی كەسانی موبتەدیع.

[ الإبانة الصغرى ٩٠ ]

ئەمە زۆر باشترە بۆی، لەوەی كە هاوەڵایەتـی كەسانێک بكات كە ئەهلـی بیدەعن.

٨- **حمادی كوڕی زید** ئەفەرمیٚ: یونس پێی ووتم، ئەی حماد: ئەگەر گەنجێک ببینـم، لەهەمـوو حاڵ و بارودۆخێـكدا، من نائومێدنیـم لە خەیـری ئەوكەسـە، واتە ئومێدی خەیرم پێی هەیە، هەتا ئەوكاتەی ئەیبینم كەهاوەڵایەتی كەسێكی مبتەدیع و بیدعەچی ئەكا، ئەوكاتە من دڵنیام ئەوكەسە بەهیلاكا چووە، تەواو.

[ الرد على المبتدعة ٩٣ ]

ئەفەرمێـت: هەموو حاڵەتێكـی خـراپ، جا بیهێنـە پێـش چـاوی خـۆت لەهەمـوو جۆرە تاوانێكـی ئەنجام داوە، ئەفەرمێـت: هەر ئومێدی خێرم پێیەتـی، مـادام هاوەڵایەتـی كەسانێک ناكـات كەخـەریكـی پەیڕەوكردنـی بیروباوەڕێـكن كەهیـچ پـەیـوەنـدی بەمەنهەجـی صـحابـەو مەنهەجـی پێغەمبەری خـوا نیـە عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ ، كەهاوەڵایەتی ئەوكەسانەی كرد، ئەوە بزانە ئەوكەسە لەناو چووە.

**٩-** پیاوێک پرسیاری کرد **له ئیمامی شەعبی**، له مەسئەلەیەکدا، دوای ووتی ڕەئی خۆتم پێ بڵێ لەم مەسئەلەیا،

ئیمام فەرمووی: والله ــ ئەگەر گۆرانیت بۆ بڵێم پێم خۆشترە لەوەی کە ڕەئی خۆمت پێ بڵێم لەم مەسئەلەیا.

[ سنن الدارمي ١٠٩ ]

واتە دین بریتیە لە قال الله وقال رسول عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ ، بەفەهمی صحابە، بەفەهمی تابعین اتباعی تابعین، نەک دین بریتی بێت لەوەی من چۆنم بێ باشەو تۆ چۆنت پێ باشەو ڕەئی تۆ چیەو ڕەئی ئەو چیە.

**١٠- ابن وضاح** لە ابوبکری کوڕی عییاشەوە ئەفەرمێ، واتە ابی بکر، ئەفەرمێ: گەنجێک مان لابوو خەڵکی ئەکوشت و مەشروبی ئەخواردەوە، ئەم گەنجە دەستی نە ئەپاراست زۆرێک لەتاوانەکان،

پاشان ووتیان ئەم گەنجە بووە بە کەسێک لەوانەی قسەی بەهاوەڵان ووتوە و جوێنی پێداون، واتە لە عەقیدەو مەنهەج و بیروباوەڕەکەی ئینحرافی کردووە و لای داوە.....،

ئەوجا حەبیبی کوڕی ابی ثابت فەرمووی: ئەو ڕۆژانەی کەتۆ ئەو کارو کردەوە ناشیرینانەی ئەتکرد لەخوێن ڕشتن و ئارەق خواردنەوە و لەو تاوانانەی کە ئەنجامتدەدا، زۆر باشتربوو لە ئەمڕۆت.

[ البدع لإبن وضاح ٨٦ ]

لەبەرئەوەی لەو ڕۆژانەدا لەوانەیە عەقیدەو مەنهەجەکەی سەلیم و پارێزراوتر بوبێت، بەڵام ئەمڕۆ کەلای داوە لە عەقیدەو مەنهەجەکەی، ئومێدی خێری پێ ناکرێت.

**١١- عەوامی کوڕی حەوشەب** بە عیسا ــی کوری فەرمoو:
ئەی عیسا دڵت بۆ الله خالیص بكە و خـۆت یـەكـلای بـكـەوە بـۆ الله سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ لەتـەواوی كاروبـارەكانتـدا، وە با ماڵ و سەروەتو سامانیش كەمبێت،
وە ئەفەرمێت : واللە ــی ئەگەر عیسا ببینم هاوەڵایەتی كەسانی « برابط » بكات، واتە ئەوكەسانەی كە خەریكی ئالەتی مۆسیقاو گۆرانی و فسق و فجورن، وە كەسانێك كە ئارەق دەخۆنەوە،
پێم خۆشترە لەوەی ببینم لەگەڵ كەسانێكدایە موناقەشەو جیدال دەكەن لەدیندا.

[البدع لإبن وضاح ١٢٢ ]

واتە كێ ؟، ئەهلی بیدەع.
تـەبعـەن بـەچـی ئیـنسـان خـۆی یـەكـلای ئـەكـاتەوە...؟، بە عەقیدە و مەنهەجێكـی سەلیـم، دواتر عیبادەتـی لەسەر بیـنـا ئەكات، چـونكـە ئـەگەر عەقیـدەت سەلیم نەبـوو عیبـادەت لەسەر شتــی پۆخلەوات بینا ناكرێ،
بزانە سەلەف بەو چەشنە لە ترسناكی بیدعەیان ڕوانیوە.

**١٢- ابن زاذان** ئەفەرمێ: ایوب پێی ووتم : ئەگەر پیاوێك لەسەر سوننەت و جەماعەت بێت، پرسیاری لێ مەكە لەچ حاڵەتێكدایە.

[ شرح أصول الإعتقاد ٦٧/١ ]

مەبـەستـی ئەوەیە لەسەر عەقیـدەی ئەهلی سوننەو جەماعە بێت ، با تاوان و سەرپێچی زۆریشی هەبێت، ئەوا ئومێدی خێری هەیە ان شاء الله تعالی.

**١٣- ئیمامی أحمد** دەربارەی ئەو کەسانەی کە زاهید و بێ پێویستن لەدونیادا و پشتیان لێکردووە و خەریکی عیبادەت کردنن،

ئەفەرمێ: مادام ئەوکەسە ئەهلی بیدەعە دوژمنی الله یە سبحانە وتعالی.

[ طبقات الحنابلة ١/١٨٤ ]

**١٤- أبوحاتم** ئەفەرمێ: گوێم لە احمدی کوڕی سنان بوو، ئەیفەرموو: ئەگەر ئەوکەسەی کە ئالەتی مۆسیقای هەیەو خەریکیەتی،

گەر لەم کەسانە دراوسێم بن و نزیکم بن، زۆرم پێ خۆشترە لەوەی خاوەن بیدعەیەک دراوسێم بێت و ئەمانەم پێ باشترە !

لەبەرئەوەی، ئەوەی کە طنبورەکەی هەیە ڕێگری لێ ئەکەم و طنبورەکەی ئەشکێنم، ئالەتە مۆسیقاکەی ئەشکێنم و لای ئەبەم.

بەڵام کەســی موبتەدیع خەڵکــی گومڕا ئەکا، دراوســێ گومڕا ئەکا، شتانێک ئەهێنێت درۆ بەدەم الله و رسول ـەکەیەوە ئەکات، عەقیدەو مەنهەجی خەڵکی بەرەو گــومــڕای ئــەبــا، بــۆیــە زۆرم پێخۆشتــرە ئەوکەسانە دراوســێــم بن لەوەی کەکەسی موبتەدیع دراوسێم بێت.

[ الإبانة ٤٧٣ ]

خۆ ئەگەر هیچیان دراوسێت نەبن ئەوە نیعمەتە، بەڵام بەجورێک ئەفەرمێ گەر ئیختیار بــەخــۆم بێت لەنێــوان ئەم دوانە، ئەبێ ئیلا یەکێکیان هەڵبژێرم، ئەوە ئەوی دیکەیان هەڵئەبژێرم و دوورئەکەومەوە لەوکەسەی کە ئەهلی بیدەعە.

**١٥-** پیاوێک ووتـی بە **یونسی کوڕی عوبەید**: ئەی باوکـی عبداللە، تـۆ ڕێـگـریـت لە ئێمـە کـردووە بـچـیـن لەلای عەمـر دانیشیـن «کەسێکی گومڕا بووە»، تۆ ڕێگریت لەئێمە کردووە کە ئەوکارە بکەین، وە بچینە لای، بـەڵام کوڕەکەی خـۆت ئەچێـت بۆلای،

فەرمـووی : کوڕی مـن؟!

ووتـی: بەڵـێ...، شێخ بەمە زۆر توڕەبوو، بەپەلە چـوو بۆلای کوڕەکەی، وە پێـی فەرمـوو: ئەی کوڕم، تۆ ڕەئـو بیرو بۆچونـی من دەزانـی دەربارەی عەمر، لەگەڵ ئەوەش کە ئەیزانـی من چۆنـم بەرامبەری و بیروباوەڕیم قبوڵ نیە، بەڵا تۆ چوویت بۆلای!

کوڕەکەشی ووتی: من فڵان کەسم لەگەڵابووە و لەگەڵ ئەودا چووم، بەجۆرێک لە جۆرەکان عوزری ئەهێنایەوە،

ئەوجا یونسـی کوڕی عوبەیـد فەرمـووی : مـن ڕێگریـم لەتۆ کـردووە زینا بکەیـت، وە لەوەی دزی بـکەیـت، وە لەوەی عارەق بـخـۆیتـەوە، بەڵام ئەگەر ئابەم تاوانانەی کەمـن ڕێگریـم کـردووە لەتۆ بگەڕێیتەوە لای اللە، زۆرم پـێ خۆشتـرە بگەیتەوە پێـی لەوەی بەڕەئو بیـرو بۆچونـی عـەمـر و هاوەڵەکانـی بگەڕێیتەوە بۆلای.

**[ طبقات الحنابلة ١/١٨٤ ]**

ئەوانە تاوانێکـن ئینـسانی پـێ کافر نابێـت، بەڵام تاوانێک کە لە عەقیدەو بیروبـاوەڕدا بـوو، یان ئینسانی پـێ کافر دەبێـت پەنا بە اللە یان ئەگەر کافریش نەبێت، بەردەوام بوون لەسەری بەرە و کوفر پەلکێشی ئەکات، تاوای لێ ئەکات ڕقی لەسوننەت بێت و لێی دوورکەوێتەوە، وە باوەش بکاتەوە بۆ بیدعەو ئەهلی بیدەع و دانیشتن لەگەڵیانداو وازهێنان لە سوننەت و ڕووکردنە بیدعە.

**١٦- اسحاقی کوڕی مەنصور** دەڵێت:

ووتم : ئایا پچڕاندنـی پەیوەندی (لەگەڵ ئە هلی بیدەع) وارد بووە لە رسول الله وە؟

- أحمـد فەرمووی : ئەوە جێگیرە لەووەوە.
- اسحاق فەرمووی : زۆر بەتوندیش.

[ مسائل الكوسج (٣٤٨٤) ]

**١٧- ابـن هانـئ** دەڵێـت : پـرسیـارم کرد لە ئیمـامـی أحمـد ، دەربـارەی پیاوێکـی موبتـەدیـع و داهێنەر لەدینـدا و بانگەوازکار بۆ ڕێبازەکەی خۆی، ئایا دەتوانرێـت دابنیشن لەپاڵی؟

ئیمام فەرمووی : نابێت لای ئەم کەسە دانیشن،

وە نابێ قسەی لەگەڵ کرێت ، بۆئەوەی بگەڕێتەوە.

[ مسائل ابن هانئ (١٨٥٥) ]

**١٨- أبو قلابە** دەفەرموێـت : دامـەنیشـن لەگەڵ ئەهلـی هەواو ئارەزوو و دووربوو لە قورئان و حەدیـث و شوێنکەوتـەی سەلەف ، یان ئەهلـی مناقەشە و دەمەدەمێ و مناقەشەکار لەدیندا ،

من ئەمین نیم لەوەی ئێوە توشی ئەو گومڕاییە بکەن کەخۆیان تێیدان ،

یان سەرتان لێ بشێوێنن لەوەی خۆتان دەیزانن و گومانتان تێیدا نیە.

[ السنة للخلال ٢/٢٨٨ (١٩٦٨) ]

**١٩- المروذی** دەڵێـت : گەشـت بە باوکـی عبدالله (ئیمامی أحمد) هاتنـی پیاوێکی موبتەدیع ، ئیمام ئینکاری ئامادەبونی کرد و بێزراوی کرد، وەفەرمووی تاوەکو تەوبەی لێدەردەکەوێت و پەشیمانەبێتەوە.

[ طبقات الحنابلة ١/١٥٠ ]

**٢٠- عبدالله** دەڵێت : باوکم بۆی گێڕامەوە،

فەرمووی : قەبری ئەهلی سونە لەوانەی تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە باخە ، قەبری ئەهلی بیدعە لەوانەی دونیا نەویست و عیبادەت کارن ، دۆڵێکە لە جەهەنەم.

تاوان بارەکانی ئەهلی سونە ئەولیایی الله ـن، دونیا نەویستو خۆپارێزەکانی ئەهلی بیدعە دوژمنی اللەن.

واتە ئەهلی سونە چەندە تاوان باریش بێت زۆر باشترە لە کەسێکی ئەهلی بیدعە بازۆر خەریکی عیبادەت و خۆئامادەکردن بێت بۆقیامەت.

**٢١- عبدالله الصيرفي** دەڵێت : أحمد بن حنبل پێی ووتم : گەر پیاوێک سەلامی لە کەسێکی موبتەدیع کرد ئەوا خۆشی دەوێت،

رسول الله ﷺ دەفەرموێت : نێزیکتان بکەمەوە لە کارێک گەر ئەنجامی بدەن ئەوا یەکتان خۆشدەوێت؟

سەلام بڵاو بکەنەوە لەنێوانتان.

**[ طبقات الحنابلة ٤٧/٢ ؛ الآداب الشرعية ٢٥١/١ ]**

**٢٢- أبو داود** دەفەرموێت : ووتم بە ئیمامی أحمد : پیاوێکی ئەهلی سونە دەبینم لە گەڵ پیاوێکی ئەهلی بیدەع ، ئایا وازبێنم لەقسەکردن لەگەڵی؟ (قسەی لەگەڵ دابڕم)؟

فەرمووی : نەخێر ، ئاگاداری بکە کە ئەو پیاوە کە لە گەڵی بووە ئەهلی بیدەع بووە، گەر وازی لێهێنا قسەی لەگەڵ بکە ،

گەر وازی نەهێنا وەک ئەو حسابی بۆبکە ،

ابن مسعود فەرموویەتی : هەرکەس بەهاوەڵەکەی دەناسرێت.

**[ طبقات الحنابلة ٤٢٩/١ ]**

**٢٣- ابن هارونی حەمال** دەڵێت : گوێم لە ئیمامی أحمد بوو ئەیفەرموو: لەگەڵ ئەهلی کەلام دامەنیشن ، گەر توابنەوە لە سونەتیشدا.

[ طبقات الحنابلة ٢/ ٤٠٥ ]

ئەهلی کەلام ئەوانەن خەریکی فەلسەفە و مەنطق و ئەو شتانەن کە بریتی نیە لە آثار و پاشماوەی سەلەفی ئومەت.

**٢٤- عبدالله** دەڵێت : ووتم بە باوکم ، واتە ئیمامی أحمد : چی دەڵێیت دەربارەی شوێن کەوتوانی حەدیث و زانایانی فەرمووده دەچنە لای شێخێک ، لەوانەیە ، مورجیئە یان شیعە یان شتێکی تێدابێت پێچەوانەی سوننەت ، ئایا دەکرێت بێدەنگ بێت و خەڵکی لێ ئاگادار نەکات ؟، یان خەڵکی لێ ئاگاداربکات؟

فەرمووی : گەر لەوانە بوو خەڵکی بۆ بیدعەکەی بانگ دەکرد وە ئیمام بوو تێیدا و بانگەوازی بۆدەکرد ، بەڵێ خەڵکی لەخراپەکەی ئاگادار کە.

[ مسائل عبدالله (١٥٩١) ]

**٢٥- مروەذی** دەڵێت : ووتم بە ئیمامی أحمد : پیاوێک هەیە خەریکی نوێژ و ڕۆژووە ،

بەڵام بێدەنگە لەقسەکردن دەربارەی ئەهلی بیدەع و خەڵکیان لێ ئاگادار ناکات ، ئیمام ڕوخساری تێک چوو ،

وە فەرمووی : گەر نوێژ و ڕۆژوی گرت و دوورکەوتەوە لەخەڵکی ، ئایا بۆ نەفسی خۆی نیە؟

ووتم : بەڵێ،

فەرمووی : کەوایە قسەبۆخۆی و جگە لەخۆشی بکات باشترە.

[طبقات الحنابلة ٣/٤٠٠]

کەوابوو ئەوکەسە باشترو گەورەترە کە ئامۆژگاری کاری خەڵکیەو خەڵکی ئاگادار دەکات لەخراپە و ترسناکی بیدعە و ئەهلەکەی.

**٢٦- ئیمامـی أحمد** دەفەرمویـت : ئێمە فرمانمان پێکراوە بە بێدەنگـی ، بەڵام بانـگ دەکرێیـن بـۆ کارێـک کە واجبـە لەسـەرمـان ڕێگـری لێبکەیـن ، وە ڕوونـی بکەینەوە ئەوەی کە پێویستە ڕێگری لێبکرێت لەوەی ووتویانە ،

پاشان بۆ ووتەکانی ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگە ﴿ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ [النحل: ١٢٥]، لەگەڵ موشریکین بدوێ بە باشترین شێوە.

[ الآداب الشرعية ٢٢٧/١ ]

**٢٧- ئیمامی شافعی** کاتێـک هەواڵێـک ئەسەرێک حەدیسێک لای جێگیـر و صەحیح بوایە ،

لاسایی دەکردەوە ،

وە باشترین خویەک کە لە ئیمامی شافعیدا نەبوە ، ئەوەیە کە هیچ کات حەزی بە کەلام نەبوو (واتە حەزی بە قسەکردن لەدیندا نە بوو بەبێ أخبرنا و حدثنا و ئایەت و فەرمودە) ،

چونکە ئەوەی ناونراوە زانستی کەلام ، جگە لە گومڕایی هیچی دیکەنیە.

بەڵکو هەموو هەوڵی ئەو تەنها بۆ فیقهـ بوە.

[ الآداب الشرعية ٢٢٠/١ ]

**٢٨– عـومـەری کوڕی عبـدالعزیز** دەیفـەرمـوو : هـەرکەسێـک دینـەکـەی بەکاربێنێت بۆ مناقەشە ، ئەوا زۆر دین و بیرو باوەڕی دگۆڕێت و زوزو لادەدا لە ڕێگا.

[ الزهد بروايه عبدالله ص٣٦٦ ]

**ئـەمـە** بريتی بـوو لە ئاگادارکرنـەوەی سەلەفـی ئێمـە رحمهـم الله تعالى، دەربارەی دوور کەوتنەوەمان لە ئەهلی بیدەع و دانەنیشتن لەگەڵیاندا، وە گوێ لـێ نەگرتنيـان و نەخـوێندنەوەی کتـاب و نوسراويـان ، وە نەبـوون بە قوتابيان و نەچون بۆلايان،

بۆيە واجـبـە ئينسانێک کە ئەيەوێت عەقيدەی بينا بکات لەسەر مەنهەجـی اصحاب و سەلەف ، پێويستە دووربکەوێتەوە لەئەهلی بيدەع، هاوەڵايەتيان نەکات و دۆستايەتيان لەگەڵدا نەکات، دانەنيشێ لەگەڵياندا، لەپای ئەوەی عەقيدەی سەليم و تەندرووست بێت،

وەيەکێک لەنيشانەکانی ئينسانـی موسڵمان ئەوەيە کە هيچ کاتـێ ئەمين نيە لەنەفسی خۆی.

هەندێک لەزانايان ئەفەرمـوون: ئەوکەسـەی ئـەمينە لەنەفسـی خـۆی ئەوە بەڕاستی نيشانەی نيفاقی تيايە، لەنيفاقەوە نزيکترە وەک لە سونئەتەوە،

نابـێ هيچ کەسـێ ئەمين بێت لەنەفسی خۆی مادام ڕۆح لەجەستەيا بوونی هەبێت چـونکە دڵی ئينسان لاوازە و هەميشە زوو کاريگەر ئەبێت، وە شيطان زياتر بۆی ئەڕازێنێتەوە،

دڵ نيە لەدەستی خۆتدا تا چۆنت بوێ بەو چەشنە هەڵی سوڕێنی، بۆيە رسول الله ﷺ ئەيفەرموو: ( يا مقلب قلوب، ثبت قلبي على دينک ) ئەی هەڵ سوڕێنەری دڵەکان کە الله ـيە سبحانە وتعالى، دڵم جێگيربکە لەسەر دينکەت.

ئێمـە ئەولاترە ئـەم دۆعـا زياتر بکەيـن وە زياتـر خـۆمـان بپارێزيـن وە دووركەوينەوە لەئەهلی بيدەع.

الله بمان پارێزێ لێیان وە ڕاگیراومـان بكات لەسەر مەنهەجـی ئەهلـی سونەو جەماعە لەوانەی دەستگرتوون بە سوننەتی رسول الله ـوە عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ ، دەستگرتوون بـەوەی كـە هاوەڵان لەسەری ڕۆشتوون، كە سەلەفـی ئەم ئوممەتە لەسەری ڕۆشتوون، لەسەر سونەت بمان ژیێنێ و لەسەر سوننەت بمان مرێنێ.

**وصلى الله وسلم على حبيبنا محمد، وعلى آله واصحابه أجمعين.**

**طارق الكردي**